کتێبخانەی تویشوو

زنجیرەی گەنجانی ئیسلام _5_

# کریسمس

## حوکمی ئاهەنگی سەری ساڵ لە ئیسلامدا

## بە بەڵگەی قورئان و سونەت

نوسینی : علی هەولێری



# حوكمی ئاهەنگی سەری ساڵ لە ئیسلامدا
# بە بەڵگەی قورئان و سوننەت

**نوسینی : علی هەولێری**



بسم اللَّه الرحمن الرحيم

الحمدللَّه الذي أمدَّ لَنَا النعمَةَ وأَبْقَاهَا، وأَبْعَدَ عَنَّا النقمَة وأَرْدَاهَا نحمدهُ أَنْ هَدَانَا للرِّسَالة، وجَنَّبنَا سُبلَ الضَلالَة، ونشكرهُ علَى ما أَمنَّ بهِ من وافرِ العَطَاء، ونعوذ بِهِ من جهْدِ البلاء، ودَرَكِ الشَّقاء، وشَماتَةِ الأعْدَاء، وأَشْهدُ أَن لا إلهَ إلا اللَّه وحده لا شريكَ له في ألوهيَّته وفي ربوبيَّته وفي أسمائه وصفاته، تنزَّه عن النِدِّ وعن الشبيه، وعن المثيلِ وعن النظير، ليسَ كمثْلِه شيءٌ وهُو السَّميعُ البَصيرْ ، وأشهدُ أَنَّ محمداً عبدهُ ورسوله، صلَّى اللَّه عليهِ وعلى آلهِ وصحبه وسلَّم تسليماً كثيراً إلى يومِ الدِّين.

ئايا پیرۆزبایی کردن بە بۆنەی جەژنی سەری ساڵی زاینی [کریس مەس] کە جەژنی گاور و خاچ پەرستانە، درووستە یان نە؟!

بەتایبەتی ئەو موسڵمانانەی لە ئەورووپا و ئەمریکا و وڵاتانی ترن لەگەڵ گاور و خاچ پەرەستان کار دەکەن ؟!

لەوەڵامدا: خوشکان و برایانی ئیماندار ئێمە وەکوو موسڵمانان اللَّه تعالی ڕێنموویی کردووین بە قورئانی پیرۆز و پەیامی خۆی بە پێغەمبەری خۆشەویستمان (صلی اللَّه علیه وعلی اله وسلم) بۆ ناردووین دینەکەی بۆ کامڵ کردووین هەموو شتێکی بۆ ڕوون کردووینەتەوە، ئێمەی موسڵمانانیش تەنها دوو جەژنمان هەیە (جەژنی ڕەمەزان و جەژنی قوربان) لەم دوو جەژنە هیچ جەژنێکی تر بوونی نیە لامان، ئاهەنگ گێڕان و پیرۆز بایی

کردن له بێ باوەڕان بە بۆنەی جەژنی سەری ساڵ و [کریس مەس] یان هەر جەژنێکی تر حەرام و قەدەغەیە بە کۆڕا و هاودەنگی زانایانی حەق.

یەکەم: ووتەی زانایان سەبارەت بەم جەژنانەوە ؟!

شێخی پایەبەرزی ئیسلام ابن تیمیة 'رحمه اللّٰه له (اقتضاء الصراط المستقيم مخالفة أصحاب الجحيم) و لة (مختصر الفتاوى المصرية)دا بە قەدەغە و حەرامی دادەنێت.

وەهەروەها شیخ لە کتێبی (اقتضاء الصراط المستقيم مخالفة أصحاب الجحيم) ئەم فەرموودەی پێغەمبەری اللّٰه (صلى اللّٰه عليه وعلى اله وسلم) دەهێنێتەوە کە فەرموویەتی: (من تشبه بقوم فهو منهم)[1] واتە: هەرکەسیك لاسایی قەومێك بکاتەوەو خۆی بەوان بچوێنێت ئەوە لەوان دەبێت.

وە پاشان دەفەرمووێ: (مشابهتهم في بعض أعيادهم توجب سرور قلوبهم بما هم عليه من الباطل، وربما أطمعهم ذلك في انتهاز الفرص واستذلال الضعفاء)[2] وە هەرکەسێك هەر شتێك لەوانە ئەنجام بدات تاوان بار دەبێت، فەرقیش نیە ئەو کارە بە مەبەستی موجامەلە بێت لەبەر خۆشەویستی یان لە بەر شەرم یان هەر شتێکی تری هاوشێوەی ئەوانە، چونکە تەنازوول دانە لە ئایین، و پتەوکردنی دەروونیە بۆ بێ باوەڕن، و فەخرکردنیان بە ئایینەکەیان .

[1] [ صحيح سنن أبي داود]

[2] [مجموع فتاوى]

وەهەورەها پێشەوا ابن القيم 'رحمه اللَّه ' بە کۆڕا و یەك دەنگی زانایان، و شوێنکەوتوانی هەر چوار مەزهەبەکە دەگێڕێتەوە لە سەر ئەوەی کە ئامادە بوون لە جەژنی سەری ساڵی زاینی کە جەژنی گاور و خاچ پەرستانە حەرام و قەدەغە کراوە، هەروەکو فەرموویەتی: (ولا يجوز للمسلمين حضور أعياد المشركين باتفاق أهل العلم الذين هم أهله. وقد صرح به الفقهاء من أتباع المذاهب الأربعة في كتبهم)[1] واتە: حەرامە و نابێت موسڵمان ئامادەی جەژنی موشریکەکان بێت، بە کۆڕا و یەك دەنگی زانایان، ئەوانەی کە حیساب بۆ ووتەیان دەکرێت، شەرع زانان و شوێنکەوتوانی هەر چوار مەزهەبەکەش بە ڕاشکاوی لە کتێبەکانیاندا ئەوەیان باس کردووە.

وەهەروەها فەرموویەتی: (وأما التهنئة بشعائر الكفر المختصة به فحرام بالاتفاق مثل أن يهنئهم بأعيادهم وصومهم فيقول؛ عيد مبارك عليك أو تهنأ بهذا العيد ونحوه: فهذا إن سلم قائله من الكفر فهو من المحرمات وهو بمنزلة أن يهنئه بسجوده للصليب: بل ذلك أعظم إثماً عنداللَّه وأشد مقتاً من التهنئة بشرب الخمر وقتل النفس وارتكاب الفرج الحرام ونحوه. وكثير ممن لا قدر للدين عنده يقع في ذلك ولا يدري قبح ما فعل، فمن هنأ عبداً بمعصية أو بدعة أو كفر ؛ فقد تعرض لمقت اللَّه وسخطه)[2] واتە: وە سەبارەت بە پیرۆزبایی کردن بە درووشمە کوفریەکان کە تایبەتن پێی، حەرامە بە کۆڕا و یەك دەنگی زانایان، وەك ئەوەی کە پیرۆزباییان لێ بکات ـ واتە: بێ

[1] [أحكام أهل الذمة]

[2] [أحكام أهل الذمة]

باوەڕان ـ بە بۆنەی جەژنەکانیان، یان ڕۆژووگردنەکانیان، و پێیان بڵێت؛ جەژنتان پیرۆز بێت، خۆشبەخت بیت لەم جەژنەتدا یان هەر ووتەیەکی هاو شێوەی ئەوانە، ئەمە ئەگەر خاوەنەکەی پارێزراو بێت لە کوفر و بێ باوەڕی، ئەوا تووشی حەرامێك بووە، وەکو ئەوەیە کە پیرۆزباییان لێ بکات بە بۆنەی سوژدە بردن بۆ خاچەکانیان، بەڵکو ئەو کارەی لە لای اللَّه تعالی گەورەتر و خراپترە لەوەی کە پیرۆزباییان لێ بکات بە بۆنەی خواردنەوەی مەی مەشروب، و کوشتنی خەڵك، و داوێن پیسی، و هاوشێوەکانیان. زۆریش لەوانەی کە ئایین لە لایان ڕێزی نیە، ئەکەونە ئەو کارەوە، و ناشزانێت ئەو کارەی چەند ناقۆلا و ناشیاوە، بۆیە هەر کەسێك پیرۆزبایی بکات لە کەسێك بە بۆنەی تاوانێك یان بیدعەیەك یان بێ باوەڕیەك، ئەوا ئەو کەسە تووشی خەشم و قین و توڕەیی اللَّه تعالی بووە.

دووهەم: ماناو ناوەڕۆکی [کریس مەس] و پێناسەی[بابا نوئێل]؟!

ئەوانەی ئاهەنگ دەگێڕن لەکوردستان و ووڵاتی تری موسڵمان نشین بە بۆنەی جەژنی سەری ساڵی زاینی [کریس مەس] [ christmas ] زۆری ناوەڕۆکی ئەو ووشیەی [کریس مەس] نازانن؟

لەبنەڕەتدا ووشەی [christ] واتە: دلسۆز ، نازناوە بۆ مەسیح کە لە زمانی یۆنانی وەرگیراوە ، وشەی [mas ] لە وشەیەکی میسری قبطی فیرعەونی وەرگیراوە کەمانای لەدایك بوونە.

کریسمس ڕۆژی [١٢/٢٥] هەموو ساڵێکە، گوایە جەژنی ڕۆژی لەدایك بونی [مسیح] یان[یسوع ] ە ، [عید میلاد الرب] واتە: جەژنی لەدایک بونی خودا ، یان [ عید میلاد إبن الرب ] واتەجەژنی لەدایك بونی کوڕی خودا. پەنا بە اللّٰه تعالی دەگرین، لەوجۆرە درۆو شیرك و کوفرە گەورەیە، جا لەو ڕۆژە ئاهەنگی گەورەی تێدا دەگێڕدرێت و ئەنجام دەدرێت، ئەو دارەی دروستی دەکەن و دەی ڕازێننەوە بە گەڵای دڕکاوی وەکو ڕەمزێك بۆ تاجی سەری مسیحە بە بۆچوونیان ، وە بەرووبومە سورەکەشی ئاماژەیە بۆ خوێنی مسیح، گوایە کاتی خۆی مسیحان کوشتوە و لەخاچیان داوە، ئەمانەش هەمووی کوفرو درۆو سەرلێشێواوی بێڕێزی و چەواشەکاریانە. جونکە عیسی (علیه السلام) نەکوژراوەو نە لەخاچیش دراوە، بەلکو اللّٰه تعالی عیسای بۆ لای خۆی بەرزی کردۆتەوە، هەروەکو اللّٰه تعالی لە قوڕئانی پیرۆز باسی دەکات و درۆکانیان پوچەڵ دەکاتەوە دەفەرمووێ:
(وقولهم إنا قتلنا المسيح عيسى ابن مريم رسول اللّٰه وما قتلوه وما صلبوه) (النساء؛١٥٧) واتە: ئەووتەیەش کە دەیاگوت بە ڕاستی ئێمە مەسیح پێغەمبەری اللّٰه عیسای کوڕی مەریەمیان کوشتووە، کەچی لەڕاستیدا نەکوشتوویانەو نە لە خاچیانداوە، پاشان دەفەرمووی: (بل رفعه اللّٰه إليه وكان اللّٰه عزيزا حكيما)(النساء؛١٥٨) واتە: نەخێر، بەڵکو اللّٰه 'عیسای' بەرز کردەوە بۆ لای خۆی، اللّٰه باڵادەست و دانایە.

ئەمەیە ڕێزو حورمەتی ئەم پێغەمبەرە ئازیزە (علیه السلام) کە لە قوڕئانە پیرۆزەکەی ئێمەی موسڵمانان دا اللَّه تعالی ڕێزی لێناوە بەرزی کردۆتەوە بۆلای خۆی.

پێناسەی ئەم پیاوە پیرەی کە ناوی لێنراوە بابانوئێل بەسەرهاتی و جێگای لەدایکبوونی:- لە هەندێك لە سەرچاوەکانی گاورو خاچ پەرەستان دا لە سەدەی حەڤدەهەمدا هاتووە دەڵێن: ناوی پیاوێکی قەشەیە [قەدیس] بە ناوی [سانت نیکۆلاس- nikolas]لە سەدەی چوارەمدا ژیاوە لەناو خێزانێکی دەوڵەمەند، کە لەبنەڕەتدا یۆنانییە و لە تورکیا لەدایك بووە و لە زمانی عیبری] زمانی جوولەکەدا[ دا ئەم وشەی (ئیل) ە بە مانای باوك و خواوەند دێت.

بەڵام لای گاورەکان وا پێناسە ناکرێت؛ چونکە گاورو خاچ پەرەستەکانیش چەند بەشێکن:- کاثۆلیك، ئۆرتۆدۆکس و پڕۆتستانت. کاتۆلیك بە پاپای ڤاتیکان پەیوەستن، بەڵام ئۆرتۆدۆکسییەکان نسبەیان کەمترە لە جیهان و باوەڕیان نییە زۆرینە بە پاپای ڤاتیکان ڕقیان لەچارەیەتی.

جیاوازیشیان زۆرە و ئیختیلافات هەیە لەنێوانیان، بۆ نموونە قەشە یۆنانییەکان یان ڕووسی و ڕۆمانییەکان ڕیش دەهێڵنەوە و زێڕ بەخۆیانەوە دەکەن، بەڵام کاتۆلیك جیاوازن؛ ریش ناهێڵنەوە و زێڕیش بەخۆیانەوە ناکەن و عیبادەتەکانیان جیایە.

کاتۆلیکەکان کە پاپای ڤاتیکان گەورەیانە بەس ئەو بۆی هەیە فەهمی ئینجیل شەرح بکات و ڕێگا نادەن کەس ئینجیل شەرح بکات هەتاکوو ئیستاش لەگەڵ یەکیش هاودەنگ نین لە ڕۆژی لەدایکبوونەکە.
کاثۆلیك ڕۆژێك پێش ئۆرثۆدۆکسییەکان دەیکەنە جەژن و ئۆرثۆدۆکسییەکان خۆشیان پێ مقەدەس ترە لە مەزهەبەکانی تر و لە ئوورشەلیم پاپای یۆنانی بۆی هەیە سەرپەرشتیی ئەوە چرایە بکات کە پێی دەڵێن چرای موقەدەس، کە گوایە لە ڕۆژی هەڵسانەوەی عیسا (علیه السلام) لەدوای لەخاچ دانی ئەم مۆمە خۆی دادەگیرسێت بەس لەسەر دەستی ئۆرتۆدۆکسیەکانیش.
لە ساڵی ٢٠٠٣ یەکێك لە نووسەرە یۆنانییەکان بە ناوی تریاندە فلۆپلۆ ئەوەی ئاشکرا کرد کە درۆ دەکەن.
ئەم شەمە بەهۆی پاترییەکی بچووکەوە ئۆتۆماتیك دادەگیرسێت و هەروەها لە لایەکی ترەوە لەودیوی ئەم وێنەی کە بە مەریەم (علیه السلام)ی دەشوبهێنن، کونێکیان لە چاوی کردبوو و بە شریقەیەك لەودیوی وێنەکە دڵۆپەئاوێکیان دەڕشت بۆ ئەوەی بە خەلکەکە بڵێن دایکی عیسی (علیه السلام) دەگری و موعجیزەیە.
زۆر لەم جۆرە شتانە دەکەن و خەڵکەکەش گومڕایە و باوەڕ دەکەن.
ئەمجا پێناسەی ئەم بابانوئێلە؛ بە پیاوچاك ناوی دەبەن و مناڵەکانی خۆیان پێهەڵدەخەڵەتێنن، کە گوایە دیارییان بۆ دێنێت لەم شەوەدا.

خۆشیان باوەڕیان پێی نییە و مناڵەکانیش هەر بڕوا ناکەن، بەڵام هەڵیاندەخەڵەتێنن. خۆیان دیارییەکان دەکڕن.
بەیانی کە مناڵەکە خەبەری دەبێتەوە، پێیدەڵێن ئەوە بابانوئێل بۆی هێناویت.
یۆنانییەکان پێیدەڵێن ئاگیۆ ڤاسیلی ئاگیۆ واتە موقەدەس لەزاراوەی تر پێیدەڵێن [سانتا کلۆز Santa Claus]، بەڵام پێناسەی خودای بۆ ناکرێت.
جا ئەوەی لێرە سەیرە، خەڵکێکی نەزانی خۆمان دەچێت دەیکڕێت یان دارەکەش دەکڕێت و دەیڕازێنێتەوە، هەروەك عەلمانییەکانی کوردستان، کە زۆر موعجیبن بە حەزارەتی جوولەکە و خاچپەرستان، شار دەڕازێننەوە.
ئەم بابانوئێلە گاورەکان خۆیان باوەڕیان بەوە نییە لەبنەڕەتدا، کەچی سەیردەکەین کافرو مورتەدەکانی لای خۆمان دەیهێننەوە بۆ نێو و وڵاتی موسڵمانان و لە بازاڕ و کەناڵەکانیان بڵاوی دەەکەنەوە و بانگەشە و ڕێکلام ی بۆ دەکەن.
خەڵکێکیش گومڕا دەکەن وەك خۆیان.خەڵکێکی نەفام و ساویلکەش شوێنیان دەکەون وای لێدێ ئەوەندە بەکەیف نین بۆ دروشمە ئیسلامییەکان و بۆ جەژنی ڕەمەزان و قوڕبان وەك ئەوەی ئەوەندە بەکەیفن بۆ جەژنی جوولەکە و خاچپەرەستان.
لە کاتێکدا ڕۆژئاوا جولەکەو خاچ پەرەستەکان نەك هەر باوەڕیان بە جەژن و دروشمەکانی ئێمە نییە، بەڵکوو نە باوەڕیان هەیە بە ئیسلام وەك دین نە بە پێغەمبەری ئێمە (صلى اللّٰه عليه وعلى اله وسلم)،

کەچی ئەم خەڵکە نەزان و ناحاڵییەی ئێمەش یادی ئەم جۆرە جەژنانە دەکەنەوە لەگەڵیان.
ئەگەر شتێکمان لە ئەورووپایە نەزانیبا وامان ئەزانی شوێنی حەوانەوەی مرۆڤەو هەموویان خەڵکی چاك باشن بەرامبەر بە موسڵمانان ؟
بەڵام نەخێر زۆربەیان تاسەر ئێسقان حاقیدن بەرامبەر بە ئیسلام. هەندێکیان هەر حیسابی مرۆڤ بۆ موسڵمانان ناکەن وخوێنی ئیمەی موسڵمانیان لا زۆر بێ نرخە ، بەتایبەتی کە جوولەکەکان دەلێن بەس ئێمە نێردراوی اللَّە ین وەك مرۆڤ و باقی تر هەمووی وەحشی و حەیوانن، بەڵام لە شێوەی مرۆڤن بۆ ئەوەی ئێمە خزمەت بکەن.
بۆیە لەپوختەی باسەکە دەڵێم: با ئاگامان لە دینەکەی خۆمان بێت و بەرچاوی ئەم خەڵکەش ڕووناك بکەینەوە تا نەکەونە ئەم تاوان و گوناحانەوە.
ئێمە خاوەنی ئەم ئیسلام پاکەین کە دوابەرنامەیە ڕێنموویی هەموو ئادەمیزادە کە هەموو جیهان کەڵك و سوود لەم هەموو زانیارییانەی ئەم قورئانەی ئێمە وەردەگرن، چۆن ئێمە بگەڕێینەوە بۆ جەهل و لاڕێیی ئەوان.
ئێمە وەك موسڵمان یادی لەدایکبوونی هەموو پێغەمبەران (علیهم السلام) بە نرخ دادەنێین، بەڵام لەژێر ڕۆشناییی قورئان وەك ئەوەی کە خوای گەورە پێیخۆش بێت بەڕێز و حوەرمەتەوە، وەك ئەوەی اللَّە تعالی فەرمانی پێکردووین دەفەرموێت:

(قولوا آمنا باللَّه وما أنزل إلينا وما أنزل إلى إبراهيم وإسماعيل وإسحاق ويعقوب والأسباط وما أوتي موسى وعيسى وما أوتي النبيون من ربهم لا نفرق بين أحد منهم ونحن له مسلمون) (البقره؛١٣٦) واته: ئەی پەیڕەوانی موحەممەد (صلى اللَّه عليه وعلى اله وسلم) ئێوە، بڵێن ئێمە باوەڕمان بە اللَّه هێناوە و بەو قورئانەش کە دابەزیوە بۆمان و بەوەش کە دابەزیوە بۆ ئیبراهیم و ئیسماعیل و ئیسحاق و یەعقووب و نەوەکانی یەعقووب.
هەروەها بەو پەیامەی کە بۆ مووسا و عیسا هاتووە و بەو پەیامانەی کە بۆ پێغەمبەران بەگشتی ڕەوانە کراوە لەلایەن پەروەردگاریانەوە و ئێمە جیاوازی ناکەین لەنێوان هیچکام لەو پێغەمبەرانەدا.
ئێمە هەموومان تەنها تەسلیمی فەرمانی پەروەردگارین.
بەڵێ؛ ئێمە وەك موسڵمانان لەدایکبوونی هەموو پێغەمبەران دەنرخێنین و حورمەت و ڕێز دادەنێین.
عیساش (عليه السلام)کە یەکێکە لەو پێغەمبەرە ئازیزانە، کە لە قورئان اللَّه تعالى باسی کردووە ودەفەرموێ: ( والسلام علي يوم ولدت ويوم أموت ويوم أبعث حيا) (مريم؛٣٣) واتە: سڵاوی پەروەردگارم لەسەرە ئەو ڕۆژەی کە لەدایك بووم و ئەو ڕۆژەش کە دەمرم و ئەو ڕۆژەش کە زیندوو دەکرێمەوە.

بەم شێوە جوانەی کە قورئان بۆمان باس دەکات نەك بەم شێوەی کە خاچپەرستانەکان باسی دەکەن و یادی دەکەن بەشەراب خواردن مۆسیقاو سەماو فەسادو خراپە.

بۆیە پیرۆزبایی لە بێ باوەڕان بە بۆنەی جەژنە ئایینیەکانیانەوە حەرامە وقەدەغەیە جا ئەگەر لە ڕابردوودا ئایینەکەشیاندا هاتبێت، بەهاتنی ئایینی ئیسلام و پێغەمبەری اللَّە (صلی اللَّە علیە وعلی الە وسلم) کە ڕەوانە کراوە بۆ هەموو خەڵك ڕۆڵی نەماوە.
هەروەکو اللَّە تعالی فەرموویەت: (ومن یبتغ غیر الإسلام دینا فلن یقبل منه وهو في الآخرة من الخاسرین) (سورة آل عمران: ٨٥) واتە: هەرکەسێك غەیری دینی ئیسلام داوا بکات بە دینی خۆی قەناعەت نەکات کەدینی ئیسلامە، عادات و تە قالیدو داب و نەریتی دینێکی تر پەیرەو بکات ئەوا خوای گەورە لێی قبوڵ ناکات وە لە رۆژی دوایدا لە زەرەر مەندان دەبێت.
دەڵێم: بە داخەوە کە ئێمە خاوەن ئەوە دینە جوان و کاملەین کە چی زۆرێک لەموسڵمانان شانازی پێوە ناکەن و قەدری نازانن دەچن عادات و داب و نەریتی کافرەکان سەیردەکەن و پەیرەوی دەکەن کە ئەوەش ئەو پەری تەنازولی کەمی تێدا دەبینرێ.
بۆیە پیرۆز بای کردن لێیان و شادی بەو بۆنانەوە ئیقرار کردنی ئەو دروشمە کوفریانەیە کە ئەوانی لە سەرن، ڕازی بوونە پێی، سەرەڕای ئەوەی کە بەو کوفرانە ڕازیش نەبێ ئەوکەسە بۆ خۆی، بەڵام نابێت حەرامە لە سەر موسڵمان کە ڕازی بن بە دروشمە کوفریەکان، یان پیرۆزبایی بەبۆنەیانەوە بکات لە غەیری خۆی، چونکە اللَّە تعالی بەوە ڕازی نابێت،

هەروەکو فەرموویەتی: (إن تکفروا فإن اللَّه غني عنكم ولا يرضي لعباده الكفر وإن تشكروا يرضه) (سورة الزمر: ٧)،واتە: گەر خۆتان بخەنە بێ باوەڕی و کوفرەوە ، بێگومان اللَّه بێ نیازە لێتان، هەر چەندە ڕازی نابێت کە بەندەکانی بێ باوەڕبن و ڕێبازی بێ باوەڕی، بەڵام ئەگەر ڕێبازی سوپاسگوزاری بگرنە بەر، بەو کارەتان ڕازی دەبێت.

وە هەروەها دەفەرمووێت: (اليوم أكملت لكم دينكم وأتممت عليكم نعمتي ورضيت لكم الإسلام دينا )(المائدة؛ ٣)واتە: ئیمڕۆ ئاین و بەرنامەکەتانم تەواو وکامڵ کرد و بەکۆتایی گەیاندو نازو نیعمەتی خۆمم بۆ تەواو کردن و ڕازیم بەوەی کە ئیسلام ببێتە بەرنامەو دین و ئاینتان (جا لەگەڵ بڕیاردانی ئەو شتانەدا کە قەدەغەکراوە لەسەرتان) ئەو دینە ئیسلامە کامڵە کە اللَّه بۆ ئێمەی هەڵبژاردووە.

یەکێك لە جولەکەکان بە پێشەوای ئیماندارن پێشەوامان عومەری کوڕی خەطاب ‘رضی اللَّه عنه’ گووت: ئێوە ئایەتێکتان هەیە لە قورئاندا دابەزیوە ئەگەر بۆ ئێمەی مەعشەری یەهود هاتبایە ئێمە ئەو ڕۆژەمان دەکرد بە جەژن پێشەوا عومەر’رضی اللَّه عنه’ لەوەڵامیدا فەرمووی: ئەم ئایەتە (اليوم اكملت لكم دينكم...) بەڵێ من دەزانم کەی دابەزی لە چ ڕۆژێکیش بوو لە چ شوێنێکیش بوو جمعە بوو ڕۆژی عەرەفە بوو کە پێغەمبەر (صلی اللَّه عليه وعلى اله وسلم) ئەو ئایەتەی بەسەردا دابەزی وە فیعلەن ئەو ئایەتە لای موسڵمانان زۆر گەورەیەو جێگای دڵخۆشییە کە خۆشحاڵی دەبرین کە

دینەکەمان کامڵە و بێ نەقصە وە دینێکە هەموو دینەکانی تری نەسخ کردووەتەوە.
کەوابوو پێویستە موسڵمانان اعتزاز بە دینەکەی خۆیانەوە بکەن، بۆیە پیرۆزبایی لێکردنیان حەرامە، هاوکار بێت لە گەڵتدا لە کارەکەت یان نە.
وە ئەگەر پیرۆزباییان لێ کردن بە بۆنەی چەژنەکەیەیانەوە، ئەوا وەڵامیان مەدەنەوە، چونکە جەژنی ئێمە نیە، ئێوە دەبێ اللَّه تعالى لەخۆتان ڕازی بکەن نەوەك کافرو بێ باوەڕان .
دەپرسم لەوانەش کە دەڵێن ئەوان بەبێ ڕێزمان دادەنێن کەلەو ڕۆژە پیرۆزبایان لێ نەکەین؟؟
لە وەڵامدا دەڵێم باشە رۆژێك لە رۆژان بینیمان جولەکەیەك یان خاچ پەرەست و گاورێك لە ئەمەریکا لە بریتانیا لە رۆژی جەژنی رەمەزان یان لە رۆژی قوربان کە جەژنی موسڵمانانە بینیمان لە ئەمەریکا یان لە بریتانیا ئاهەنگ بگێرن و خۆش حاڵی خۆیان دەربرن؟
بە هۆی جەژنی موسڵمان ئەی کەئەوان ئەوە ناکەن بۆ ئێمە بچین ئاهەنگ بگێرین بەهۆی جەژنێکی ئەوانەوە کە لە دینی خۆیانیشدا داهێنراوە نەك هەر لە دینی ئسلامدا داهێنراو بێت.
بەراستی لاسایی کردنەوەی کافرەکان کارێکی خراپە، ئوممەتی ئیسلامی لە بواری دونیایی و پێش کەوتنی زانستیدا هیچ رێگر نییە سوود لە کافر وەربگرێت و وەکو ئەوان پێش کەوتوو بێت ئەما لە بواری بیروباوەرو رەوشت و داب و نەریت و عاداتمان دینەکەی ئێمە و رەوشتی موسڵمانان

زۆر جوان ترو بەرزترو بەرێزترە لە کافرەکان، بۆ موسڵمان نیەو تاوان بار دەبیت لای اللَّه تعالی.

ئامۆژگاریم بۆ موسڵمانان ئەوەیە: کە ئەو کارە نەکەن بەڵکو شانازی بەدینەکەی خۆتانەوە بکەن و دەستی پێوە بگرن و پارێزگاری لێ بکەن، ئەوە مایە سەرفرازی و سەرکەوتوویی دنیاو دوارۆژە بۆتان بەویستی اللَّه تعالی بەتایبەتی ئەوانەی لەدەرەوە دەژین ئاگادر بن.

پێغەمبەری ئازیزمان (صلی اللَّه علیه وعلی اله وسلم) فەرموویەتی: (اتق اللَّه حیثما کنت واتبع السیئة الحسنة تمحها وخالق الناس بخلق حسن) [رواه أحمد والنسائي] واتە: لە هەر کات و حاڵەتدا بوویت، لە اللَّه بترسە و پارێزگار بە! بەشوێن هەڵە و تاواندا چاکە بکە تا بیسرێتەوە و لەگەڵ خەڵکیدا بە ڕەوشتی جوان هەڵسوکەوت بکە.

ئێمەی موسڵمانان دەبێت ڕەنگدانەوەی ئیسلامان تێدا بێت، نابێت تێکەڵی ئەم جەژن و یادانە بین.






